ناوی کتێب: لە پێشوازی ڕەمـەزان
ئـامــادەکردنی: هۆشیار نصرالدین
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنــوێن
دیزاینی تێکست: زەردەشــت کاوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣
چــاپ: نـاوەندی ڕێنـوێن
تیـــــراژ: (١٠٠٠) دانــــە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە ( )ــی ساڵی (٢٠٢٣)ــی پێ دراوە.








## ناوەندی ڕێنوێن


07511408868 - 07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله و صحبه ومن والاه ، أما بعد ..

ئەم نوسینەی بەردەستت " لە پێشوازی ڕەمەزان " گوزەرێکی خێرایە وەک بیرخستنەوەیەک بۆ زۆرێک لە بابەتەکانی پەیوەست بەڕەمەزانەوە وەک ڕوونکردنەوەیەکی خێرای ئەحکامەکانی هەریەکە لە:

- ڕۆژووگرتنی پێش ڕەمەزان .
- ڕۆژووی ڕۆژی شک .
- بینینی مانگ .
- نیەت هێنان .
- پارشێوکردن .
- واجب و سوننەت و بەتاڵ کەرەوەکانی ڕۆژوو .
- نوێژی تەراویح و شەونوێژ .
- دە شەوی کۆتایی و شەوی قەدر .
- زەکاتی فیطر .
- نوێژی جەژن و ئادابەکانی ڕۆژی جەژن .

– لەگەڵ چەند بابەتێکی تری پەیوەست بەڕەمەزانەوە لەڕووی تەڕهیب و تەڕغیبەوە بۆ بەخۆداچوونەوە و ئارەزوومەندبوون لەبەدەستهێنانی پاداشت .

بۆ نوسینی ئەم کتێبە زۆر سودم بینیوە لە کتێبی " زاد الصائم " ی محمد صالح المنجد خوای گەورە پاداشتی بداتەوە .

لە کۆتایی دا لەخوای پەروەردگار تکامە لێمان وەرگرێ و ببێتە مایەی سود بۆ نوسەر و خوێنەر و قەبوڵی پێ ببەخشێ .

**وصلى الله وسلم على رسولنا محمد وعلى آله و صحبه أجمعين**

**هوشيار نصرالدين**

**١٦/ ٥/ ١٤٤٤**



## تامەزرۆیی گەیشتن بە ڕەمەزان



پێشینی چاکمان رحمهم الله بەچەند مانگ پێش ڕەمەزان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ڕەمەزان و تامەزرۆی گەشتن بوون بەو مانگە پیرۆزە و ئەیانفەرموو: " اللهم بلغنا رمضان "، کاتێکیش دەگەشتنە ڕەمەزان بەباشترین شێوە عیبادەتیان تیا دەکرد ...

## فەزڵی گرتنی مانگی ڕەمەزان

دوو پیاو پێکەوە موسڵمان بوون ، یەکێکیان هەوڵ و کۆششی زیاتر بوو لەوی تر و، بەشداری غەزای کردو شەهید بوو، ئەویتریان دوای ساڵێ وەفاتی کرد .

طەلحە دەڵێ: لەخەودا بینیم من لای دەرگای بەهەشتم، دەبینم ئەمە هەردووکیانە، سەرەتا مۆڵەت دراوە ئەوەی دووەم وا ساڵێ دواتر وەفاتی کرد و، پاشان مۆڵەت دراوە ئەوەی یەکەم وا شەهید بوو، پاشان بەمن وترا: بگەڕێوە تۆ هێشتا کاتت نەهاتوە .

طەلحە بەیانی خەوەکەی باسکرد ، خەڵکی سەیریان هات، گەشتە پێغەمبەر ﷺ و، بۆیان باسکرد ، فەرمووی: " لە چ شتێکی ئەوە سەیرتان دێ ؟"

وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ، ئەوەیان هەوڵی زیاتر بوو پاشان شەهیدکرا ، کەچی ئەویتریان لە پێش دا چووە بەهەشتەوە!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: " مەگەر ساڵێ دوای ئەو نەمایەوە؟"

وتیان: بەڵێ .

فەرمووی: " گەشتە ڕەمەزان و ڕۆژووی گرت ، ئەوەنە و ئەوەنە ڕکات نوێژی نەکرد لە ساڵەکە ؟"

وتیان: بەڵێ .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: " دەی نێوانیان لە نێوانی ئاسمانی و زەوی دوورترە ". [١]

-----------------------

(١) أحمد:١٣٨٩، وابن ماجه: ٣٩٢٥ واللفظ له ، وابن حبان: ٢٩٨٢ وحسنه لغيره شعيب الأرناؤوط .



## ئـامـادەكاری بـۆ ڕەمـــەزان



- زۆر ڕۆژوو گرتن لە پێش ڕەمەزان ، عائیشە ﵂ دەڵێ: نەمبینیوە پێغەمبەر ﷺ لەهیچ مانگێكی تر بە ئەندازەی شەعبان ڕۆژوو بگرێ. (١)

- دانەوەی قەرزەكانی ڕۆژووی ڕەمەزانی پێشوو، عائیشە ﵂ دەڵێ: قەرزاری ڕەمەزان ئەبووم نەمدەتوانی بیگێڕمەوە تەنیا لە شەعبان نەبێ. (٢)

- تەوبەكردن و گەڕانەوە بۆلای پەروەردگار .

- دوعاكردن بۆ گەشتن بە ڕەمەزان وەک لە پێشتر باسمان كرد " اللهم بلغنا رمضان ".

- خۆ شارەزاكردن لە پوختەی ئەحكامەكانی .

- خۆ ئامادەكردن بۆ عیبادەت كردن تیایدا بەتایبەتی : قورئان خوێندن و بەخشین و عومرە و ئیعتیكاف .

- وازهێنان لە هاوڕێی بەتاڵ و بێ ئیش و هاوڕێیەتی كەسی هیممەت بەرز و خاوەن ئاكاری جوان .

---

(١) البخاري: ١٩٦٩ ، ومسلم: ١١٥٦

(٢) البخاري: ١٩٥٠ ، ومسلم: ١١٤٦

– کۆتایی هێنان بە کار و وەزیفەی قورس بۆئەوەی بەتەواوی ئامادەی گرتنی ڕۆژووەکەی و شەونوێژەکەی ببی.

– خۆ سەرقاڵکردن بە قورئان خوێندنەوە ، چونکە ڕەمەزان مانگی قورئانە .

## دوو ڕۆژ پێــش ڕەمـــەزان



پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "پێش ڕەمەزان مەکەون بەگرتنی ڕۆژێ یان دوو ڕۆژ، مەگەر کەسێک عادەتی ڕۆژوگرتنێکی هەبێ". [١]

زانایان دەڵێن: پێشوازی لە ڕەمەزان مەکەن بەڕۆژوو گرتن لەسەر نیەتی ئحتیاط بۆ ڕەمەزان. [٢]

نابێ پێش هاتنی مانگی ڕەمەزان بەڕۆژێک یان دوو ڕۆژ ڕۆژوو بگیرێ بەنیەتی ئەوەی نەوەک ڕەمەزان بێت و ئێمە لێمان خواردبێ ، مەگەر کەسانێک عادەتی گرتنی ڕۆژوویەکی هەبێ و لەسەری بەردەوام بێ وەک گرتنی ڕۆژنا ڕۆژێ ، یا گرتنی هەموو دووشەممە و پێنج شەممانێ ئەوکاتە بۆ ئەوکەسە درووستە ، هەروەها بۆ کەسانێ ڕۆژووی ڕەمەزان یا ڕۆژووی

-----------------------

(١) البخاري: ١٩١٤ ،ومسلم: ١٠٨٢

(٢) بڕوانە: فتح الباري



نەذر قەرزارن دیسانەوە درووستە، بەڵام بیخاتە کاتێکی تر لەبەر ئەم نەهیە باشترە واللە أعلم .

ئەو فەرموودەیەش کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " ئەگەر شەعبان نیوە بوو ڕۆژوو مەگرن". [1] ئەگەرچی هەندێ لە زانایانی وەک ئەحمەد و یەحیای کوڕی مەعین و بەیهەقی رحمهم الله بە زەعیفیان داناوە [2] ، بەڵام هەندێ لەو زانایانەی دیکە کە بە سەحیحی دەزانن دەڵێن: دیسانەوە ئەمە بۆ کەسانێکە کە عادەتیان نیە ڕۆژوو بگرن با لەدوای پازدەی شەعبانەوە ڕۆژوو نەگرن بۆئەوەی بەهێزبن لە پێشوازی مانگی ڕەمەزان. [3]

---

(١) أبوداود: ٢٣٣٧، والترمذي: ٧٣٨، وابن ماجە: ١٦٥١ وصححه شعيب الأرناؤوط .

(٢) بڕوانە: فتح الباري

(٣) بڕوانە: تحفة الأحوذي.



## ڕۆژی گومـــان ( یوم الشـــك )



### یەومـو شـــك چـــیە ؟

ئەو ڕۆژەیە کە باس دەکرێ مانگ بینراوە ، بەڵام جێگیر نەبوە کێ بینیویەتی ، یان کەسێک بینیویەتی بەڵام شاهێدی وەرناگیرێ ، یان دوو فاسق بینیویانە و شاهێدییان وەرناگیرێ. (١)

ڕۆژوو گرتنی یەومو شک حەرامە و درووست نیە، صیلەی کوڕی زوفەر دەڵێ: لای عەممار بووین لەو ڕۆژەی کە گومان دەکرا ڕەمەزانە یا شەعبان ، مەڕێکی برژاویان هێنا ، هەندێ کەس دوورکەوتنەوە و لێیان نەخوارد ، عەممار وتی: هەرکەسێ ئەم ڕۆژە بگرێ سەرپێچی باوکی قاسمی کردوە ﷺ(٢) .

ترمذي رحمه الله ئەڵێ: فەرموودەکە حەسەن و سەحیحە ، کردەوەی زۆربەی ئەهلی علمی لەسەرە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و ، تابعینی دوای ئەوان(٣) .

---

(١) بڕوانە: عون المعبود شرح سنن أبي داود.

(٢) أبوداود: ٢٣٣٤ ، والترمذي: ٦٨٦ ، والنسائي: ٢١٨٨ ، وابن ماجه: ١٦٤٥ وقوى إسناده شعيب الأرناؤوط.

(٣) الترمذي عند حديث ( ٦٨٦ ) .



## ئێـوارەی ٢٩ی شــەعبان



سوننەتە ئێوارەی ٢٩ی شەعبان چاودێری بینینی مانگ بکرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "ڕۆژەکانی شەعبان بژمێرن لەبەر ڕەمەزان" . (١)

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تر ئەفەرموێ ﷺ " : بەبینینی مانگ ڕۆژوو بگرن و ، بەبینینی بیشکێنن ، ئەگەر لێتان دیار نەبوو ئەوا ٣٠ شەعبان تەواو بکەن " (٢)

### ئایا بینینی مــانگ بە ئــامێرە پێشکــەوتوەکان درووستە ؟

هەردوو زانای سەردەم ئیبنوباز و ئیبنو عوثەیمین رحمهما الله دەڵێن: درووستە بینینی مانگ بە ئامێرە پێشکەوتوەکان لەبەرئەوەی بینینە بەچاو نەک بە حسابی فەلەکی . (٣)

---

(١) الترمذي: ٦٨٧ وحسنه الألباني و شعيب الأرناؤوط.

(٢) البخاري: ١٩٠٩ ، ومسلم: ١٠٨١.

(٣) بڕوانە: مجموع فتاوى ابن باز.



## یەکـەم شــەوی ڕەمــەزان



دوای ئەوەی مانگ بینراو یەکەم شەو هات ئەم چەند ئامۆژگارییە لەبیر مەکە:

- شوکری خودا بکە بەوەی گەشــتی بە مـانگـی پڕ بەرەکەتی ڕەمەزان .

- پیرۆزبایی لەیەک کردن بە گەشتن بەم مانگە پیرۆزە و دوعاکردن بۆ یەکتر بەوەی خودا یارمەتی دەربێ لەسەر جوان بەسەر بردنی .

- ڕاستگۆیی لە تەوبەکردن ، نەک تەنیا دواخستنی تاوانەکان بۆ دوای ڕەمەزان ، بەداخەوە زۆرێک تەنیا لە مانگی ڕەمەزان نوێژ دەکات ، یا قورئان دەخوێنێ ، یا وازدێنێ لە گوێگرتن لە گۆرانی و ... هتد.

- خۆ پاڵفتەکردن و پاککردنەوەی نەفس لە هەموو خویەکی خراپ و زویربونێک لەگەڵ خوشک و برایانی ئیماندارت .

- نەنگیە شەیتان بەسترابێتەوە و تۆ هێشتا سەرپێچی بکەی !

- ئەگەر هەبوو بووی هــەواڵی خـــزم و دۆست و دراوســێ هەژارەکەت بزانە باوەکو برسێتی و هەژارییان لەسەر کۆ نەبێتەوە.

- ئەگەر نەبوو بووی سەبرِ بگرە و زیادەڕەوی مەکە لە خواردن ئامادەکردن .



# نـــیـــەتی ڕۆژوو



نیەت مەرجە بۆ هەر کردەوەیەکی چاکە، ڕۆژووش کردەوەیەکە لە کردەوە چاکەکان و پێویستی بە نیەتە .

## کاتەکـــەی :

پێش نوێژی بەیـانی یە ، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "هەرکەسێ لەشەودا نیەتی ڕۆژووی نەبێ ڕۆژووی بۆ نیە ".[١]

## شـــێوازەکـەی:

نیەت بریتیە لە گرێدانی دڵ ( عەزم ) لەسەر ئەنجامدانی شتێک و، پێویست ناکا بە دەم بوترێ، هەروەها هەرکەسێ پارشێو بکات بە نیەتی ڕۆژووگرتن هەر درووستە .

## دووبـارەکردنەوەی نیــەت:

لای جمهوری زانایان رحمهم الله دەبێ بۆ هەر ڕۆژێ نیەت تازە بکەیتەوە چونکە هەر ڕۆژێ عیبادەتێکی سەربەخۆیە و، لای مالک رحمه الله یەکجار نیەت هێنان بۆ هەموو مانگەکە درووستە .

---

(١) أبوداود: ٢٤٥٤ ، والترمذي: ٧٣٠ ، والنسائي: ٢٣٣١ ، وابن ماجه: ١٧٠٠ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط.

## پـــارشـــێـو



پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " پارشێو بکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە " . [١]

لە بەرەکەتەکانی پارشێو :

- شوێنکەوتنی سوننەت .
- پێچەوانەی گاور و جولەکە .
- یارمەتیدەرە بۆ ڕۆژوو .
- یارمەتیدەرە بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لەکاتی خۆی دا .
- کاتەکەی کاتی وەگیرانی نزا و پاڕانەوەیە .
- کاتی أستغفر الله کردنە .

کاتێ بە پارشێو ئەوترێ پارشێو کە دوای نیوەی شەو بکرێ نەک پێش نیوەی شەو ، بەداخەوە خەڵکی ئێستا لە سوننەتی ژیان کە خودا عزوجل دایناوە لایان داوە و شەو تا درەنگێ یاخود تا بەیانی ناخەون ، کە ئەمەش زیانی بۆ جەستە هەیە و هەروەها دەبێتە هۆی تەمەڵی لە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی و باقی عیبادەتەکانی تر، یان کەسانێک تا نزیکی کاتی پارشێو و نوێژی بەیانی بێدارن و

---

(١) البخاري: ١٩٢٣ ، ومسلم: ١٠٩٥



خەریکی کات بەفیڕۆدان و خواردن و خواردنەوەن و کە دەگاتە ئەو کاتە پڕ بەرەکەتە دەخەون و هەم پارشێوەکە کە بەرەکەتە و، هەمیش نوێژی بەیانی یان لەدەست دەچێ !

## مژدەیەك بۆ ئەوانەی پارشێو دەكەن



پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " پارشێو خواردنی بەرەکەتە، هەرگیز وازی لێ مەهێنن ئەگەر قومە ئاوێکیش بووە، چونکە خــودا عزوجــل و فریشــتەکانی سـەڵاوات دەدەن لەسەر ئەوانەی پارشێو دەکەن ". [١]

زانایان ئەفەرموون: سەڵاواتی خودا عزوجل لەسەر بەندەکانی بریتیە لە ڕەحمەت و و ڕازیبوون و ، سەڵاواتی فریشتەکانیش بریتیە لە نزاکردن و داوای

لێخۆشبون کردن بۆیان .

جا چ مژدەیەک لەوە گەورەترە کە تۆ هەستی بۆ پارشێو کردن بۆئەوەی یارمەتیدەربێ لەسەر ڕۆژووی ڕۆژەکەت کە ماندوو نەبیت و برسی و تینو نەبی لە هەمانکاتدا خودا عزوجل و فریشتەکانی سەڵاواتت لەسەر بدەن !

-------------------------

(١) أحمد: ١١٠٨٦ وصححه شعيب الأرناؤوط.



## ڕاهێنانی منداڵان لەسەر ڕۆژوو گرتن



زۆر گرنگە دایکان و باوکان منداڵەکانیان ڕابێنن لەسەر ڕۆژوو گرتن، چونکە بەڕاستی هەر شتێک منداڵ هەر لە سەرەتاوە ڕا بهێنرێ لەسەری دواتر کە گەورەبوو ئاسان دەبێ لای .

ڕوبەیعی کچی موعەویذ ﵄ سەبارەت بە ڕۆژووی عاشـورا دەڵێ: " ئێمـــە ئەو ڕۆژەمـــان دەگـرت و بە منداڵەکانیشمان دەگرت و، لە خوری یاریمان بۆ درووست ئەکردن ئەگەر یەکێک لەوان بۆ خواردن بگیرایە ئەو یارییەمان پێدەدا تا ئێوارە ". [١]

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕاهێنانی منداڵان لەسەر ڕۆژوو گرتن . [٢]

---

(١) البخاري: ١٩٦٠ ، ومسلم: ١١٣٦.

(٢) بڕوانە: فتح الباري.



## خۆشەویست کردنی ڕۆژوو لای منداڵان



خۆشەویست کردنی ڕۆژوو لای منداڵان بەچەند ڕێگایەک دەبێ لەوانە :

- کڕینی دیاری بۆیان ڕۆژانە .

- پێشبڕکێ درووست کردن لە نێوان ئەندامانی یەک خێزان یا هاوڕێ و دراوسێ و خزم و دانانی خەڵات لەسەری .

- بە نەرمی پێیان بوترێ: خۆشەویستمان ﷺ ڕۆژووی دەگرت.

- ئێمە کاتێ وەک ئێوە منداڵ بووین ڕۆژوومان دەگرت .

- هان دانیان لەسەر ئارام گرتن هەرکاتێ داوای خواردنیان کرد بەوەی کە هاوەڵان رضي الله عنهم کردیان یارییەک یا شتێکیان بدرێتە دەستەوە یا یارییەکیان لەگەڵدا بکرێ ، نەک مۆبایل و ئایپاد و ئەوانەیان بدرێتە دەستەوە کە زیانی بۆیان هەیە .

- بیرهێنانەوەیان بە پاداشتی ڕۆژوو .



## فەزڵەکانی مانگی ڕەمـەزان



گومانی تیا نیە کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام و عیبادەتێکی گەورەیە موسڵمان خۆی پێ نزیک دەکاتەوە لە پەروەردگاری .

لێرەدا بە پوختی هەندێ لە فەزڵەکانی مانگی ڕەمەزان دەژمێرین:

- ڕەمەزان بۆ ڕەمـــەزان دەبێتە هـۆی سـڕینەوەی تاوانەکانی نێوانیان . (١)

- دەرگایەک لەدەرگاکانی بەهەشت ناوی ڕەییانە و تەنیا ڕۆژووگرانی لێوە دەچێتە ژوورەوە . (٢)

- عومرەیەک لە ڕەمەزان یەکسانە بە حەجێک لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ. (٣)

- بۆنی دەمی ڕۆژووگران بەهۆی نەخواردن و نەخواردنەوەوە لەبۆنی میسک لای خودا خۆشەویست ترە . (٤)

---

(١) مسلم: ٢٣٣ / ١٦

(٢) البخاري: ١٨٩٦ ، ومسلم: ١١٥٢

(٣) مسلم: ١٢٥٦

(٤) البخاري: ١٩٠٤ ، ومسلم: ١١٥١



- هەرکەسێ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ و باوەڕی وابێ خودا عزوجل واجبی کردووە لەسەری و چاوەڕێی پاداشتەکەی بکات لەهەموو تاوانەکانی پێشووی خۆشەبن .[1]

- لە ڕەمەزان دا نوێژی تەراویح و شەوی قەدر هەیە کە ئەوە لە شوێنی خۆی باسی گەورەییان دەکەین .

- لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە خودا عزوجل خۆی دەفەرموێت: " ڕۆژوو بۆ منە و خۆم پاداشتی لەسەر ئەدەمەوە " .[2]

---

(١) البخاري: ٢٨٤٠ ، ومسلم: ١١٥٣

(٢) البخاري: ١٩٠٤ ، ومسلم: ١١٥١



## ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لەسەرکێ واجبە؟



لەسەر کەسێ واجبە ئەم مەرجانەی تێدابێ :

- موسڵمان بێ .

- خاوەن عەقڵ بێ واتە لەسەر بەخشراو ( شێت ) واجب نیە .

- باڵغ بێ، واتە لەسەر منداڵ واجب نیە .

- توانای ڕۆژوو گرتنی هەبێ ، واتە نەخۆش نەبێ یان زۆر بەساڵاچوو نەبێ.

- نیشتەجێ بێ ، واتە لەسەفەرنەبێ.[١]

-----------------------

(١) بڕوانە: پوختەی شەریعەت لە ئامادەکردنی بەندەی تاوانبار.



## پـــایـــەکانی ڕۆژوو



ڕۆژوو چەند پایەیەکی هەیە کە پێویستە کەسی ڕۆژووگر ئاگای لێ بێت بۆئەوەی ڕۆژووەکەی بەتاڵ نەبێتەوە :

– نیەت هێنان کە پێشتر باسمان کرد .

– خۆ گرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە .

– خۆ گرتنەوە لە جووت بوون ( جیماع ).

– خۆ نەڕشاندنەوە بە خۆویستی . [١]

-------------------------

(١) بڕوانە: پوختەی شەریعەت

## ئەوانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە

ئەوانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە یان لە خۆ خاڵیکردنەوەکانە وەک خۆ ڕشاندنەوە بە خۆویستی و جووت بوون و حەیز ، یان خۆ پڕکردنە وەک خواردن و خواردنەوە بە خۆویستی .

بۆ زیاتر شارەزابوون و ئاسانکاری بەخاڵ دەیانژمێرین:

- ئەوەی بگاتە قوڕگ بە خۆویستی .
- خۆ ڕشاندنەوە بە خۆویستی .
- جووت بوون ( جیماع ) بە خۆویستی .
- هێنانەوەی مەنی بەدەستبازی ( خۆ ڕەحەت کردن ) .
- هاتنی خوێنی حەیز .
- منداڵبوون ئەگەر خوێنیشی لەگەڵدا نەبێ .
- هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام . [١]

### ئەمانەش ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە

- شۆردنی گورچیلە ئەگەر پێویستی کرد بە هات و چۆ کردنی خوێن و ماددەی تر وەک ماددەی خۆراکی (موغەذی ) .

---

(١) بڕوانە: پوختەی شەریعەت



- بەکارهێنانی ماددەی خۆراکی ( موغەذی ) .

- ئەو چارەسەرانەی لە ڕێگەی لوتەوە بگاتە قورگ .

- هەر پشکنینێک بــۆ هەناوبینین ( ناظــور ) لەڕێگەی کۆمەوە بێ یان لەڕێگەی قورگەوەبێ .

- ئەو بوخارەی کە بۆ ڕەبوو بەکاردەهێنرێ ئەگەر هێندە چڕبێتەوە و بڕژێتە قورگەوە .



## ئەمانە ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە



- قەترەی چاو یان گوێ .
- دان هەڵکێشان یان چاندن بەمەرجێ شت نەچێتە قوڕگەوە .
- دان شۆردن بە هەویری دان .
- سیواک کردن .
- ئەوەی پێست هەڵی دەمژێ وەک مەرهەم یا هەر ماددەیەکی تری چەورکردن.
- بۆنکردن .
- عەدەسەی چاو .
- ڕشانەوە بەبێ ویست .
- غەرغەرە .
- ئاو ڕادانە لوت .
- تامکردنی چێشت بۆ خانمان یان چێشت لێنەران .
- چاوڕەشتن ، بەڵام بەشەو بکرێ باشترە .
- حیجامە کردن ، بەڵام بەشەو بکرێ باشترە .
- خوێن بەربوون .
- ئەوانەی پەیوەستن بە باری تەندرووستیەوە بخرێتە دوای ڕەمەزان باشترە ئەگەر زیان بە خاوەنەکەی نەگەیەنێ .





## بێ نوێژبوون

ئەگەر سپێدە ( فەجر ) دەرکەوت و ڕۆژووەوان بێ نوێژبوو کێشەیەک درووست ناکا بۆ سەر ڕۆژووەکەی، بەڵام پێویستەکا زوو غوسل بکات بۆئەوەی نوێژی بەیانی لەدەست دەرنەچێ .

هەروەها ڕەحەت بوون لەخەودا ڕۆژوو ناشکێنێ بە پێچەوانەی خۆ ڕەحەت کردن بە خۆویستی .

## دەرچوونی هەردوو ئاوی مەذی و وەدی



مەذی ئاوێکی سپی لینجە لای پیاوان لەکاتی شەهوەت یاخود یاریکردن و دەسبازی لەگەڵ خێزان دەردەچێ و ڕۆژووی پێ بەتاڵ نابێتەوە لەبەرئەوەی خۆپاراستن لێی ئەستەمە ، بەڵام باشتر وایە پیاو ئەو یارییانە لە ڕۆژدا نەکات .

هەروەها وەدی ئاوێکی لینجی چڕە و لەپاش میز دەردەچێ و لەزەتی لەگەڵدا نیە و ڕۆژووی پێ بەتاڵ نابێتەوە ، هەروەها غوسل واجب ناکات ، بەڵکو تەنیا دەستنوێژی پێ بەتاڵ دەبێتەوە .





## بیانوو ( عــوذر ) ی ڕۆژوو نـەگران

ئەوانەی لەڕەمەزان ئەکرێ بەڕۆژوو نەبن :

- نەخۆش

نەخۆش ئەبێ بەدوو جۆرەوە:

### ١- نەخۆشی کاتی:

کەسێک لە مانگی ڕەمەزان نەخۆش دەکەوێ یان نەختێ پێش ڕەمەزان و نەخۆشیەکەی کاتیە و درێژخایەن نیە . ئەم کەسە دەبێ پاش چاکبوونەوەی ڕۆژووەکەی بگرێتەوە .

### ٢- نەخۆشی درێژخایەن :

کەسێک نەخۆشە و نەخۆشیەکەی درێژخایەنە و چاوەڕێی چاکبوونەوە ناکات. ئەم کەسە ڕۆژوو ناگرێ و کەفارەتەکەی دەدات.

خوای پەروەردگار ئەفەرموێ : {وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ}. البقرة: ١٨٥



## گەشتیار ( موسافیر )



کەسێک سەفەری هەبوو ئەگەر پێش بانگی بەیانی نیشتەجێ بوو هێشتا سەفەرەکەی نەکردبوو ، دەبێ ڕۆژوو بگرێ ئەمەش ڕای جمهوری زانایانە [١]، چونکە هێشتا سەفەرەکەی نەکردووە و واجبەکەی لەسەرە ، بەڵام دواتر ڕۆژ بووەوە و سەفەری کرد و ڕۆژووەکەی لەسەر نارەحەت و قورس بوو بۆی هەیە ڕۆژووەکەی بشکێنێ .

بەڵام ئەگەر پێش بانگی بەیانی کەوتەڕێ و لە کاتی بانگەکە لەسەفەربوو ئەوا بۆی هەیە هەر لەسەرەتاوە ڕۆژوو نەگرێ ئەمەش کۆڕای زانایان ( ئیجماع ) ی لەسەرە .[٢]

---

(١) بڕوانە: صحيح فقه السنة وأدلته .

(٢) هەمان سەرچاوە .





## حوكمی ڕۆژووی گەشتیار

ئەگەر گەشتیار ( موسافیر ) ڕۆژووەكەی لەسەر نارەحەت و قورس نەبوو :

- جمهوری زانایان دەڵێن ڕۆژوو بگرێ باشترە ، چونكە خودا عزوجل دەفەرموێت: { وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ }. البقرة: ١٨٤

- هـەندێكی تر لە زانـــایـان دەڵێن ڕۆژوو نەگـــرێ باشترە.[١]

---

(١) بڕوانە: صحيح فقه السنة وأدلته ، هەروەها پێگەی : الدرر السنية

## حوكمی ڕۆژووی
## گەشتیاری نیمچە بەردەوام



ئەوانەی بەهۆی پیشەكەیانەوە بەردەوام لەسەفەر و گەشتدان وەک فڕۆكەوان و شۆفێری بارهەڵگر و .... هتد ئەوانە بۆیان هەیە ڕۆژوو نەگرن و دواتر قەزای بكەنەوە لەبەر گشتی فەرمایشتی پەروەردگار كە مۆڵەتی داوە بۆ گەشتیار و پەیوەستی نەكردووە بە هیچ شتێكەوە: {وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ}. البقرة: ١٨٥



## دووگیان و شیردەر



ئافرەتی دووگیان و شیردەر بۆیان هەیە ڕۆژوو نەگرن لەمانگی ڕەمەزان ئەگەر لە ترسی خۆیان بوو یان لە ترسی کۆرپەکەیان بوو .

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " خودا ڕۆژووی لەسەر گەشتیار و دووگیان و شیردەر هەڵگرتوە ". [1]

یانی واجب نیە لەسەریان تا لەسەفەر بن یاخود تا دووگیان و شیردەر بن ، ئەگینا دوای ئەو حاڵەتە واجبە چونکە ڕۆژوو پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام و بەهیچ لا ناچێ .

---

(١) أحمد: ١٩٠٤٧ ، وأبوداود: ٢٤٠٨ ، والترمذي: ٧١٥ ، والنسائي: ٢٢٧٤ ، وابن ماجه: ١٦٦٧ وحسنه الترمذي و الألباني و شعيب الأرناؤوط.



## دووگیان و شیردەر ئەگەر ڕۆژوویان نەگرت چیان لەسەرە ؟



- ئەگەر لەترسی خۆیان ڕۆژوویان نەگرت ئەوا تەنیا قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکەیان لەسەرە و ، ئەمەش ڕای جمهوری زانایانە .

- ئەگەر لەترسی کۆرپەکەیان ڕۆژوویان نەگرت ئەوا دیسانەوە تەنیا قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکەیان لەسەرە و ئەمەش ڕای ئەبوحەنیفە و بەشێکە لە زانایانی سەلەف و هەروەها هەریەکە لە ئیبنوباز و ئیبنوعوثەیمین ئەمەیان بەلاوە پەسەندە کە تەنیا قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکەیان لەسەرە بەبێ کەفارەت و بەخشینی خواردن . [١]

---

(١) بڕوانە: پێگەی الدرر السنیة



## تەنیا کەفارەت بەس نیە
## بۆ دووگیان و شیردەر



ئیبنو باز رحمه الله سەبارەت بە ئەثەرەکەی ئیبنو عەبباس رضي الله عنهم دەڵێ: ئەوەی ڕیوایەت دەکرێ لە ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەرەوە کە دووگیان و شیردەر تەنیا کەفارەتیان لەسەرە و پێویست ناکا قەزای ڕۆژووەکەیان بکەنەوە وتەیەکی مەرجوحە و پێچەوانەی بەڵگە شەرعیەکانە ، خودا عزوجل دەفەرموێت: { وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ }. البقرة: ١٨٥

دووگیان و شیردەر پاشکۆ دەکرێن بە نەخۆشەوە نەک لە حوکمی بەساڵاچوو و نەتوانا بن . (١)

هەروەها ئیبنو عوثەیمین رحمه الله هەمان ڕا هەڵدەبژێرێ کە تەنیا قەزاکردنەوەیان لەسەرە و دەڵێ: ئەمە ڕاستترین ڕایە لام، لەبەرئەوەی ئەوپەڕی ئەمانیش وەک نەخۆش و گەشتیار وان و تەنیا قەزایان لەسەرە . (٢)

---

(١) بڕوانە: مجموع فتاوى : ١٥/ ٢٢٧.

(٢) بڕوانە: الشرح الممتع: ٦/ ٢٢٠.



## ڕۆژووی بەساڵاچوو



ئەو ژن و پیاوەی بەهۆی زۆری تەمەنیانەوە بێ هێز و نەتوانا بوون لەوەی ڕۆژوو بگرن ، زانایان کۆڕان لەسەرئەوەی کە دەتوانن ڕۆژوو نەگرن و قەزاشیان لەسەر نیە . [1]

بەڵام ڕاجیان لەسەرئەوەی کە دەبێ کەفارەتەکەی بدەن یا نا. [2]

ئەگەر منداڵ و نەوەکانیان حسابی نەخۆشی درێژخایەنیان بۆ بکەن و کەفارەتی ڕۆژووەکەیان بۆ بدەن لەوە باشترە حسابی بەخشراو (شێت) یان بۆ بکەن لەبەر ڕێزگرتنیان .

---

(١) صحيح فقه السنة وأدلته.

(٢) هەمان سەرچاوە.





## سوننەتەکانی ڕۆژوو

- زوو بەربانگ کردن . [١]
- درەنگ پارشێو کردن . [٢]
- وازهێنان لە قسەی پوچ . [٣]

### زوو بەربـــانگ کردن :

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " خەڵکی لە خێردان تاوەکو زوو بەربانگ بکەنەوە " . [٤]

بەڵام زوو بەربانگ کردن مانای ئەوەنیە پێش بانگ ڕۆژووەکەت بشکێنی ، بەڵکو مەبەست لێی ئەوەیە کە بانگ درا بەربانگەکەت دوا نەخەیت ، ئەگەر هەرچی بەردەست بوو ڕۆژووەکەتی پێ بشکێنی، ئەگەریش هیچ بەردەست نەبوو وەک ئەوەی ناو ئۆتۆمبێل بی یاخود بەڕێگاوەبی ئەوکات بەنیەت ڕۆژووەکەت دەشکێنی و بەمەش پاداشتی زوو بەربانگ کردنت دەست دەکەوێ .

---

(١) البخاري: ١٩٥٧ ، ومسلم: ١٠٩٨

(٢) البخاري: ٥٧٦

(٣) البخاري: ٦٠٥٧

(٤) البخاري: ١٩٥٧ ، ومسلم: ١٠٩٨.



## بەچی بەربانگ بکەینەوە ؟

پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی نوێژی مەغریب بکات بەچەند خورمایەکی تەڕ بەربانگی دەکردەوە، ئەگەر خورمای تەڕ نەبوایە بە خورمای وشک ، ئەگەر ئەویش نەبوایە بە چەند قومە ئاوێک. (١)

## پاداشتەکە جێگیربوو إن شاء الله

پێغەمبەر ﷺ کاتێ بەربانگی بکردایەتەوە ئەیفەرموو: " ذَهَبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ، وَثَبَتَ الْأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ ". (٢)

تینوێتی ڕۆشت و دەمارەکان تێراوبوون و پاداشتەکە جێگیربوو إن شاء الله .

## خۆشی ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگ

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " بۆ ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیە ، کاتێ بەربانگ دەکات دڵخۆش دەبێت و، کاتێ دەگاتەوە بە پەروەردگار دڵخۆش دەبێ بە ڕۆژووەکەی ". (٣)

دڵخۆشی کاتی بەربانگ دەکرێ ئەو خۆشیە سروشتیە بێ کە بۆت ڕەوایە خواردن و خواردنەوە بخۆیت و ، دەکرێ ئەوەشبێ کە عیبادەتێکت بە پایان گەیاند و دڵخۆشەبی کە تەواو ئەنجامت داوە.(٤)

---

(١) أحمد: ١٢٦٧٦ ، وأبوداود: ٢٣٥٦ وصححه شعيب الأرناؤوط.

(٢) أبوداود: ٢٣٥٧ وحسنه الألباني و شعيب الأرناؤوط.

(٣) البخاري: ١٩٠٤ ، ومسلم: ١١٥١.

(٤) بڕوانە: فتح الباري.



## وەك ئەو پاداشتت بۆ هەیە

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "هەرکەسێ بەربانگ بۆ ڕۆژووەوانێ ئامادە بکات وەک ئەو پاداشتی بۆ هەیە بەبێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ڕۆژووەوانەکە کەم ببێتەوە ". (١)

ڕووکەشی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر بەخورمایەکیش بێ هەر پاداشتەکەی دەستدەکەوێ بەبێ ئەوەی تێری بکات . (٢)

هەروەها ئەمە بۆ ڕۆژووی فەرز و سوننەتیش دەبێ .

چەند ڕێنماییەک بۆ خوانی ئێوارانی ڕەمەزان

- زیادەڕەوی مەکە لە درووستکردنی چەند جۆر چێشت و خواردن و خواردنەوە .

- بیرت لای دراوسێ و خزمە هەژارەکەت بێ بەشی ئەوانیشت بیرنەچێ .

- بەهیچ شێوەیەک وێنەی خوان بڵاو مەکەرەوە .

- زۆر خۆری مەکە بۆئەوەی نوێژی تەراویح و عیبادەتەکانی ترت بەجوانی بۆ ئەنجام بدرێ.

---

(١) الترمذي: ٨٠٧ وقال: هذا حديث حسن صحيح ، وابن ماجه: ١٧٤٦ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط.

(٢) مجموع فتاوى ابن عثيمين: ٢٠/ ٩٣.



## نوێژی تەراویح



یەکێک لە بەرەکەتەکانی مانگی ڕەمەزان نوێژی تەراویحە کە پێغەمبەر ﷺ لەفەزڵی تەراویح ئەفەرموێ: " هەرکەسێ شەونوێژی ڕەمەزان بکات - باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشت بێ - لەتاوانەکانی پێشوی خۆشەبن ". [١]

بۆیە گرنگە ئەم هەلە زێڕینە لەدەست نەدەین و زیندووی بکەینەوە و ئەنجامی بدەین بەوشێوەیەی کە لە سوننەتی خۆشەویست ﷺهاتوە.

### حوکمی نوێژی تەراویح

نوێژی تەروایح سوننەتێکی موئەکەدەیە، ئەبوهوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هانی دەدا لەسەر نوێژی تەروایح بەبێ ئەوەی فەرمانی پێیان بکردایە بەفەرمانێکی یەکلاکەرەوە.[٢]

هەروەها دایکە عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ چەند شەوێک ئەم نوێژەی لەمزگەوت دەکرد و شەو لەدوای شەو هاوەڵان زیاتر دەهاتن و لەگەڵی دا نوێژەکەیان دەکرد ، لە سێیەم شەو یان چوارەم شەو بوو لەمزگەوت نوێژەکەی نەکرد، کاتێ

---

(١) البخاري: ٣٧ ، ومسلم: ٧٥٩.

(٢) البخاري: ٢٠٠٩ ، ومسلم: ٧٥٩ واللفظ له.



ڕۆژ بوەوە فەرمووی: " ئەوەی کردتان بینیم، هیچ ڕێگر نەبوو لەوەی دەرچم بۆلاتان و لەمزگەوت نوێژەکە بکەم تەنیا ئەوەنەبێ ترسام فەرز ببێ لەسەرتان ". [١]

## نوێژی تەراویح بەجەماعەت لەمزگەوت

وەک لە پێشتر زانیمان پێغەمبەر ﷺ ئەم نوێژەی بەجەماعەت و لەمزگەوت کردووە و دواتریش لەبەر هۆکارێک وازی لێهێناوە لە مزگەوت بیکات ، کەواتە درووستە لە مزگەوت و بەجەماعەت بکرێ و هاوەڵان رضي الله عنهم لەسەردەمی عومەر رضي الله عنه ڕایان هاتە سەر ئەوە کە مادام ئەو هۆکارە نەماوە بەجەماعەت و لەمزگەوت ئەنجامیان دا . [٢]

ئەمەش بووە کۆڕای هاوەڵان رضي الله عنهم لەسەر نوێژی تەروایح بەجەماعەت و لەمزگەوت . [٣]

## ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژی تەروایح

نوێژی تەروایح هەر شەو نوێژە و سنوری بۆ نیە و تا لە تواناداهەیە بۆت هەیە نوێژ بکەیت . [٤]

---

(١) البخاري: ١١٢٩ ، ومسلم: ٧٦١.

(٢) البخاري: ٢٠١٠

(٣) المغني لابن قدامة: ٢/ ١٢٤

(٤) بڕوانە: الاستذكار : ٢/ ١٠٢



بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزان و جگە لە ڕەمەزان لە ١١ ڕکات زیاتری نەکردوە . [١]

## نـوێــــژی ویـتــر



نوێژی ویتر یەکێکی ترە لەو عیبادەتانەی کە خەڵکێکی زۆر وا دەزانێ تایبەتە بەڕەمەزان وەک نوێژی تەروایح ، بەڵام لەڕاستیدا وانیە ، بەڵکو نوێژی ویتر یەکێک بووە لەو نوێژانەی کە پێغەمبەر ﷺ لەسەفەر و نیشتەجێ دا هەرگیز تەرکی نەکردوە . [٢]

### حوکمـی نوێــژی ویـتــر :

نوێژی ویتر سوننەتی موئەکەدەیە، ئەمەش ڕای جمهوری زانایانە و هەروەها پێغەمبەر ﷺ کاتێ موعاذی نارد بۆ یەمەن بۆئەوەی خەڵکی بانگ بکات بۆ ئیسلام و فێریان بکات ، دوای بانگکردنیان بۆ یەکخواپەرستی و باوەڕهێنان بە پێغەمبەر ﷺ کە نێردراوە لەلایەن خوداوە، پێی فەرموو: " ئەگەر لەمەدا گوێڕایەڵت بوون ، ئەوا ئاگاداریان بکەرەوە کە خودا پێنج نوێژی لەسەریان فەرزکردوە لەهەموو شەو و ڕۆژێکدا ". [٣]

------------------------

(١) البخاري: ٢٠١٣ ، ومسلم: ٨٣٧ هەروەها بڕوانە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا لە وەرگێڕانی بەندەی تاوانبار

(٢) بڕوانە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا لە وەرگێڕانی بەندەی تاوانبار

(٣) البخاري: ١٣٩٥ ، ومسلم: ١٩



ئەگەر نوێژی ویتر واجب بوایە ئەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەموعاذ دەکرد کە خەڵکی فێربکات و نەیدەفەرموو پێنج نوێژ ، هەروەها بەڵگەی تر زۆرە لەسەر ئەوەی کە نوێژی ویتر واجب نیە .

## ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژی ویتر :

نوێژی ویتر بەچەند شێوەیەک هاتوە لەوانە:

- یەک ڕکات
- سێ ڕکات بەیەک تەحیات
- پێنج ڕکات بەیەک تەحیات
- حەوت ڕکات بەیەک تەحیات و دوو تەحیات یش هەر درووستە
- نۆ ڕکات بە دوو تەحیات لە ڕکاتی هەشتەم تەحیاتی یەکەم و لە ڕکاتی نۆیەم تەحیاتی دووەم ئەخوێنرێ و سەلام ئەدرێتەوە.(١)

بەڵام لە هەمووی باشتر ئەوەیە کە دوو ڕکات دوو ڕکات شەونوێژ بکرێ و کۆتا نوێژ ویتربێ بەیەک ڕکات . (٢)

## کاتی نوێژی ویتر :

کۆتایی شەو باشترین کاتی نوێژی ویترە بۆ کەسێ بتوانێ هەستێ ، ئەگەر نا ئەوا هەر لەسەرەتای شەوەوە بکرێ باشترە .

---

(١) بڕوانە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا لە وەرگێڕانی بەندەی تاوانبار

(٢) البخاري: ٤٧٢ ، ومسلم: ٧٤٩

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " ئەوەی ترسی هەبوو لەکۆتایی شەو هەڵنەستێ با لەسەرەتای شەوەوە ویتر بکات ، ئەوەی ئارەزوومەندی هەبوو لەکۆتایی شەو هەستێ با ویتر لەکۆتایی شەو بکات ، چونکە نوێژی کۆتایی شەو فریشتەکان ئامادەی دەبن و ئەوەش باشترە ". [١]

## قورئان خوێندن لە نوێژی ویتر :

سوننەتە لە ڕکاتی یەکەم سوڕەتی ( الأعلى ) و، لەڕکاتی دووەم سوڕەتی (الكافرون) و، لەڕکاتی سێیەم سوڕەتی ( الإخلاص ) بخوێنرێ .

ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ویتری دەکرد بە ( **سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى** ) و، ( **قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ** ) و، (**قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ** ). [٢]

## قنوتــی ویتــر :

دوعای ویتر ( قنوت ) درووستە لە نوێژی ویتر بکرێ و [٣]، پەیوەست نیە بەڕەمەزانەوە یاخود بەنیوەی دووەمی ڕەمەزانەوە

-----------------------

(١) مسلم: ٧٥٥

(٢) أحمد: ٢٧٢٠ ، والترمذي: ٤٦٢ ، والنسائي: ١٧٠٢ ، وابن ماجه: ١١٧٢ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط

(٣) أحمد: ١٧١٨ ، وأبوداود: ١٤٢٥ ، والترمذي: ٤٦٤ ، والنسائي: ١٧٤٥ ، وابن ماجه: ١١٧٨ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط



چونکە فەرموودەکان بە ڕەهایی ( مطلق ) هاتوون و پەیوەست نەکراون بەکاتەوە . [(١)]

## ئەوەی لە سوننەت هاتوە

لەدوعای قنوتی ویتر ئەوەی لە سوننەت هاتوە چەند دوعا و شەیەکی کورت و گشتگیرە وەک لەفەرموودەکەی حەسەنی کوڕی عەلی رضي عنهما هاتوە : " اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، وَلَا يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ ". [(٢)]

جا مامۆستای بەڕێز :

- بەدرێژکردنەوەی دوعای ویتر خەڵکی عەزێت مەدە .

- لە سوننەت لامەدە .

- زۆر لەخۆت مەکە بۆئەوەی ئاواز و سەروا ( سجع ) دانێی بۆ دوعاکان .

- جارجار مەیخوێنە بۆئەوەی خەڵکی وانەزانن واجبە .

---

(١) بڕوانە: أصل صفة صلاة النبي ﷺ : ٣/ ٩٦٩

(٢) أحمد: ١٧١٨ ، وأبوداود: ١٤٢٥ ، والترمذي: ٤٦٤ ، والنسائي: ١٧٤٥ ، وابن ماجه: ١١٧٨ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط



- گریان لەکاتی قورئان خوێندن لەپێشترە وەک لەکاتی دوعا چونکە یەکەم لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە . [١]

## زیکری دوای ویتر :

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە نوێژی ویتر سەلامی بدایەتەوە سێجار ئەیفەرموو: " سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ " و ، لە سێیەم جار دەنگی بەرز دەکردەوە . [٢]

## دوو ویتر لەیەك شەودا نیە :

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " دوو ویتر لەیەک شەودا نیە ". [٣]

کەواتە ئەگەر لەگەڵ ئیمام نوێژی ویترت ئەنجامدا تا کۆتایی ئەوا ناتوانی لەو شەوەدا نوێژی ویتر دووبارە بکەیتەوە یاخود نوێژی تاک بکەیت ( ١ ڕکات و ٣ و ٥ و ٧ و ....) ، بەڵام ئەتوانی شەونوێژی تر بکەی بە جووتی ( ٢ ڕکات و ٤ و ٦ و ....).

---

(١) أحمد: ١٦٣١٢ ، وأبوداود: ٩٠٤ ، والنسائي: ١٢١٤ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط

(٢) أحمد: ١٥٣٥٨ ، والنسائي: ١٧٣٢ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط

(٣) أحمد: ١٦٢٩٦ ، وأبوداود: ١٤٣٩ ، والترمذي: ٤٧٠ ، والنسائي: ١٦٧٩ وصححه الألباني و لكن حسنه شعيب الأرناؤوط



## ژنـــان و مـزگـــەوت



پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " ڕێگری مزگەوت مەکەن لە ژنەکانتان ، لەکاتێکدا ماڵەکانیان باشترە بۆیان " . [١]

کەواتە درووســـتە ژنـــان ئامادەی نوێـــژەکان بن لە مزگەوت لە ڕەمەزان و جـــگە لە ڕەمەزانیش ، بەڵام لە ماڵەکانیان نوێژەکانیان بکەن باشترە بۆیان وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی .

**ئەگەر ژنان هاتن بۆ مزگەوت دەبێ :**

– پابەندی حیجابی شەرعی بێت .

– مۆڵەت لە بەخێوکەر یان مێردەکەی وەرگرێ .

– کەمتەرخەمی نەکات لە فەوتاندنی ئەرکێکی گەورەتر وەک یارمەتیدانی دایکی یاخود چاودێری دایک و باوکی یاخود منداڵەکانی.

– بۆن لەخۆی نەدات و نەبێتە هۆی فیتنە بۆ پیاوان .

–لەدەرچونەکەی شتێکی حەرام ڕوونەدات وەک بەتەنیا بێتەوە لەگەڵ سایەق تەکسی یان برای مێردەکەی یان هەرکەسێکی تری نا مەحرەم .

– دەنگ بەرز نەکەنەوە .[٢]

-----------------------

(١) أحمد: ٥٤٦٨ ، وأبوداود: ٥٦٧ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط

(٢) بڕوانە: زاد الصائم ی محمد صالح المنجد

## مــنداڵ و مــزگـــەوت



سوپاس بۆ خوای پەروەردگار ئێمەی کورد میللەتێکی موسڵمانین و زۆربەی درووشمە ئیسلامیەکان جێبەجێ دەکەین و دڵمان پێی خۆشە ...

هەربۆیە دەبینین لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزان منداڵانێکی زۆر لە گەڕەک و کۆڵان ڕوودەکەنە مزگەوت بەتایبەتی لە کاتی ئێواران و بەربانگ ، بۆیە:

- زۆر گرنگە دایک و باوک پەروەردەیەکی جوانی بکەن و فێری بکەن چۆن هەڵس و کەوت بکات .

- زۆر گرنگە مامۆستای مزگەوت و پیاوان و ئەهلی مزگەوت پێشوازیان لێ بکەن و فێریان بکەن .

- دەبێ درکی ئەوە بکرێ کە ئێستا چەند کار دەکرێ لەسەر بەلاڕێدا بردنی بیر و هزر و ڕەفتاری منداڵەکانمان .

- گرنگە ئەگەر ئەو منداڵە باوکی یان دایکی لەگەڵ بوو لای خۆی دای بنێ بۆئەوەی ژاوە ژاو درووست نەکات و عەزێتی نوێژخوێنان نەدات .

- زۆر گرنگە مزگەوت و نوێژ لای منداڵ خۆشەویست و شیرین بکرێ .

- لانی کەم با سەبرمان لەسەریان هەبێ و نەبینە هۆی تۆرانیان لەمزگەوت و نوێژ .



## فیلەکان چەن زۆرن لە ڕەمــەزان



ڕەنگە ئەم ناونیشانەت بەلاوە سەیربێ،

بەڵام کە ڕوون دەبێتەوە ئەوکات دەزانی سەیر نیە !

پێشەوا مالک ڕەحمەتی خوای لێبێ وەک عادەتی خۆی دانیشتبوو لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەتی فەرموودەی دەکرد و فێرخوازان لەدەوری دانیشتبوون..

کەسێک هاواری کرد و وتی: فیلێکی گەورە هات بۆ مەدینە.

فێرخوازان هەموو بەیەکجار ڕاپەڕین و ڕۆشتن بۆ تەماشاکردنی فیل جگە لەیەک فێرخواز نەبێ ئەویش یەحیای کوڕی یەحیای لەیثی بوو!

مالک پێی وت: چیتە بۆ نەڕۆشتی فیل ببینی ، چونکە لە ئەندەلوس فیل نیە ؟

وتی: من لەوڵاتی خۆمەوە هاتووم بۆئەوەی بڕوانمە تۆ و، لە زانست و ڕەفتارت فێر ببم ، نەهاتووم بۆ سەیری فیل .

مالک پێی سەرسام بوو ناوی لێنا عاقڵی ئەندەلوس . (١)

ئەگەر ڕامێنین لەم چیرۆکە دەبینین لەو هەموو فێرخوازە تەنیا یەکێکیان زانیبووی بۆچی هاتووە و ئامانجەکەی چی یە .

---

(١) بڕوانە: الموطأ تەبعەی مؤسسة الرسالة

بۆیە دوودڵ و ڕاڕا نەبوو و وزەکەی بەچەپ و ڕاست خەرج نەکرد .

ئەوەی ئامانجەکەی دیاریکردبوو و پشتی بەخودا بەستبوو پێگەیشت .

ڕیوایەتی یەحیای کوڕی یەحیای لەیثی بۆ موەطەئی مالک جێگای پشت پێبەستن و موعتەبەرە و بەڵام ئەو فێرخوازەکانی تر کەڕۆشتن بۆ تەماشاکردن مێژوو بۆمان باس ناکەن لەم زەمانەی خۆمان فیلەکان دووبارە ئەبنەوە .. بەڵام بەشێوەی جیاواز جیاواز بەتایبەتی لەمانگی ڕەمەزان ...

**خەڵکی لە ڕەمەزاندا دەبن بەدوو بەشەوە:**

**بەشێکیان**: ئامانجەکەی دیاری کردووە و ئەزانێ چی ئەکات و چاوەڕێی چ بەرهەمێک دەکات .

**بەشێکی تریان**: بێ ئاگایە و نازانێ خەریکی چیە بۆیە فیلە جیاوازەکان دەیرفێنن و دەیخەڵەتێنن

جا کەناڵەکان فیلن

گۆرانی و بەرنامە و فلیمە دۆبلاژکراوەکان فیلن

فلیمەکان و تۆپێنەکان فیلن

تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و هاوڕێی کات بەسەربەر فیلن

بۆیە وریابە و کاتەکانت بەگرنگ بزانە و ئامانجەکەت دیاری بکە وهەوڵی بەدەستهێنانی بدە .



## پێش ئەوەی پەشیمان ببینەوە



پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " لوتی بەخۆڵاچێ - ڕسوا بێ - ئەوکەسەی ڕەمەزانی بەسەرا دێ و پاشان دەڕوا پێش ئەوەی لێی خۆش بن ".[١]

جا پێویستە هەر لەسەرەتاوە ئامانجەکە دیاری بکەین و هەوڵی ڕەزامەندی خودا و لێخۆشبونی بدەین بۆئەوەی لە کۆتاییەکەی پەشیمان نەبینەوە ، چونکە ڕۆشت ناگەڕێتەوە .

---

(١) أحمد: ٦٤٥١ ، والترمذي: ٣٥٤٥ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط

## ڕەمەزان مانگی جیهاد و تێکۆشان



مانگی ڕەمەزان لە پێشدا مانگی جیهاد و تێکۆشان بوو ، هەروەک چۆن مانگی قورئان و شەونوێژ و بەخشین و باقی عیبادەتەکانی تر بوو .

بەداخەوە ئێستا لای زۆرێک – تەنیا ئەوانەی خودا ڕەحمی لێکردبن – بۆتە مانگی خواردن و خەوتن ، بەشەو هەر خەریکی خواردن و کات بەسەر بردنە و ، بەڕۆژیش لێی خەوتوە و جاری وا هەیە بۆ نوێژە فەڕزەکانیش ئامادە نابێ ..

لە دیارترین ئەو غەزا و جەنگانەی کە لە مێژووی موسڵمانان لەمانگی ڕەمەزان ڕوویانداوە :

- غەزای بەدری گەورە ساڵی ٢ ی کۆچی .
- فەتحی مەککە ساڵی ٨ ی کۆچی .
- گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تەبوک ساڵی ٩ ی کۆچی.
- جەنگی قادسیە ساڵی ١٥ ی کۆچی .
- فەتحی ئەندەلوس ساڵی ٩٢ ی کۆچی .
- جەنگی حەطین بەسەرکردایەتی صلاح الدین ساڵی ٥٨٤ ی کۆچی .



## هەمووی ڕەحمەت و لێخۆشبوون و ئازادکردنە



لای خـــەڵکی وا بـــڵاوە کە: " سەرەتـــای ڕەمـــــەزان ڕەحمەتەو، ناوەڕاستەکەی لێخۆشبوونەوە و، کۆتاییەکەی ئازادبوونە لە ئاگر " [١]. بەڵام سەحیح نیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ !

بەڵکو ئەوەی بەسەحیحی هاتوە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " بەڕاستی خودا لەکاتی هەموو بەربانگێ ئازادکراوی هەیە ، ئەویش لە هەموو شەوێکدا" [٢].

-----------------------

(١) سلسلة الأحاديث الضعيفة: ١٥٦٩

(٢) أحمد: ٢٢٢٠٢ ، وابن ماجه: ١٦٤٣ واللفظ له ، وصححه شعيب الأرناؤوط



## بزانە دین لە کێ وەردەگری



گومانی تیا نیە لەمانگی پیرۆزی ڕەمەزان لەبەرئەوەی خەڵکی دەگەڕێتەوە سەر عیبادەتەکانی نوێژ و ڕۆژوو و مزگەوت و جەماعەت و بەخشین و زەکات ، بەشێوەیەکی گشتی جۆش و خرۆشێک هەیە و بەدی دەکرێ ، کە بەداخەوە دەبێ موسڵمان لە ڕەمەزان و جگە لە ڕەمەزانیش هەروا بەردەوام ببێ لەسەر عیبادەت و هات و چۆی مزگەوت و قورئان خوێندن و باقی عیبادەتەکانی تر .

جا بەوهۆیەوە کە باسمان کرد کەناڵەکان بەوانەشەوە کە کەناڵی ئیسلامی نین دەستدەکەن بە دانانی بەرنامەی فەتوا و وتاردان و زۆریش دەبێ ، بەتایبەتی ئێستا بەهۆی سۆشیاڵ میدیاوە زیاتر بووە ، جا پێویستە لەسەر موسڵمان بزانێ فەتوا لەکێ وەردەگرێ و گوێ لە کێ دەگرێ .

ئیبنو سیرین رحمه الله دەڵێ: بەڕاستی ئەم زانستە دینە و بڕوانن و بزانن لە کێ دینەکەتان وەردەگرن [١].

---

(١) مسلم: في مقدمة الصحيح



## دەی کـۆتـــایـی



بەداخەوە حاڵی ئێستای موسڵمانان چەند پێچەوانەیە لەگەڵ حاڵی پێغەمبەرﷺ .

سەرەتا با بزانین حاڵی پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە ؟

دایکە عائیشە رضي الله عنها بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دە شەوی کۆتایی بهاتایە ناوقەدی توند دەکرد – دووردەکەوتەوە لە خێزانەکانی – ، شەوەکەی زیندوو دەکردەوە – بەعیبادەت و خواپەرستی – ، خێزانەکانیشی خەبەرەکردەوە . [١]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دە شەوی کۆتایی ئیعتیکافی دەکرد.[٢]

### ئەی حاڵی ئێستای موسڵمانان چۆنە ؟

بەداخەوە ئێستا خەڵکی ئەو دە شەوە هەر خەریکی بازاڕ کردنە بە بیانوی جەژنەوە ، بۆ چاو لە پێغەمبەر ﷺ ناکەیت و خەریکی عیبادەت بیت و توێشوو کۆ بکەیتەوە بۆ قەبر و قیامەتت !؟

-----------------------

(١) البخاري: ٢٠٢٤ ، ومسلم: ١١٧٤

(٢) البخاري: ٢٠٢٦ ، ومسلم: ١١٧٢



سەرەڕای ئەوەی بازاڕکردنەکە کات کوشتنە و لە دەستدانی گەورەترین شەوانی ساڵە – کە هەر ئەمە بەتەنیا پێویستی بەگریانە – کەچی تێکەڵاوییەکی زۆری ناشەرعی ڕوودەدات و پاشان دەکرێ بە سەعاتێ یان دوو سەعات ئیش و کارەکانت تەواو بکەیت ، یاخود لە پێش ئەو دە شەوە خۆت ئامادە بکەی بۆ جەژن و پێداویستیەکانت بکڕی ...

## فەزڵی دە شەوی کۆتایی :

– پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "هەرکەسێ شەوی قەدر زیندوو بکاتەوە باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشت بێ ، لەتاوانەکانی پێشوی خۆشەبن". [١]

– کردەوە لە شەوی قەدر خێرترە لە هەزار مانگ (٨٣ ساڵ و ٤ مانگ ). [٢]

– قورئانی تیا دابەزیوە .

---

(١) البخاري: ٣٥ ، ومسلم: ٧٦٠

(٢) سورەتی القدر



## شـــەوی قـــەدر



سەبارەت بە شەوی قەدر دیار نیە چ شەوێکە ، حیکمەت لەمەش ئەوەیە کە هەر دە شەوەکەی زیندوو بکەینەوە و پاداشتی زیاترمان دەست بکەوێ .

بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: " بەدوایدا بگەڕێن لە شەوە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی ". (١)

یانی شەوەکانی ٢١ و ٢٣ و ٢٥ و ٢٧ و ٢٩ ، بەڵام ..

شەوی ٢٧ نزیکترینە کە شەوی قەدر بێت ، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ شەوی ٢٣ تا سێ یەکی یەکەمی شەو زیندووی کردەوە ، پاشان شەوی ٢٥ تا نیوەی شەو زیندووی کردەوە ، بەڵام لە شەوی ٢٧ تاوەکو نزیکی پارشێو زیندووی کردەوە. (٢)

### ئایا شەوی قەدر جێگیرە لەیەك شەودا ؟

چەند ڕیوایەت و ئەثەرێک هاتوە کە شەوی قەدر شەوی بیست و سێ یە ، یان بیست و حەوتە ، یان بیست و نۆیە . (٣)

-----------------------

(١) البخاري: ٢٠١٦ ، ومسلم: ١١٦٧

(٢) أحمد: ٢١٤١٩ ، وأبوداود: ١٣٧٥ ، والترمذي: ٨٠٦ ، والنسائي: ١٦٠٦ ، وابن ماجه: ١٣٢٧ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط

(٣) بڕوانە: صحيح الجامع: ژمارەکانی: ٢١٨٣ - ٢٢١٩

ئیبنو عوثەیمین رحمه الله دەڵێ: ڕاجح – سەرخراو – لای ئەهلی علم ئەوەیە کە: شەوی قەدر دەگوازرێتەوە جارێ لە شەوی بیست و یەکە و، جارێ لە شەوی بیست و سێ یە و، جارێ لە شەوی بیست و پێنجە و، جارێ لە شەوی بیست و حەوتە و، جارێ لە شەوی بیست و نۆیە ، دەکرێ لە شەوە جووتەکانیش بێت ". [١]

## لەشـەوانی قـــەدر:

پێویستە لەشەوانی قەدر ڕەچاوی ئەمانە بکەین:

– کاتەکانمان بە زیکر و قورئان خوێندن و شەونوێژ بەڕێ بکەین .

– خواردن و خواردنەوە درووستە و هیچی تێدا نیە بەڵام نەبێتە شەو چەرە و هەر بەخواردن و خواردنەوە بەسەری بەرین .

– دوعاکردن لەبیر نەکەین و لەو دوعایانەش کە لە سوننەت هاتوە: " اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ ؛ فَاعْفُ عَنِّي ». [٢]

– وەک باسمان کرد پێغەمبەر ﷺ خۆی توند دەکرد و دوور دەکەوتەوە لە خێزانەکانی ، بەڵام جووت بوون ( جیماع ) درووستە

-------------------------

(١) مجموع فتاوى ابن عثيمين: ١٣/ ٤٥٤

(٢) أحمد: ٢٥٣٨٤ ، والترمذي: ٣٥١٣ ، وابن ماجه: ٣٨٥٠ وصححه الألباني و شعيب الأرناؤوط



و هیچی تێدا نیە ، چونکە خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: { أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ }. البقرة: ١٨٧

– خەوتن درووستە و هیچی تێدا نیە ، بەڵام تا بتوانی نەخەوی باشترە . [١]

---

(١) بڕوانە: پێگەی ئیسلام ویب: ژمارەی فەتوا : ٤٠٨٧١

## ئیعتیکاف

ئیعتیکاف بریتیە لە مانەوە لەمزگەوت بەمەبەستی عیبادەت.

دوو مەرجی هەیە:

١- نیەت

٢- مانەوە لەمزگەوت [١]

پێغەمبەر ﷺ دە شەوی کۆتایی ئیعتیکافی دەکرد و لەمزگەوت دەمایەوە بۆ عیبادەت کردن . [٢]

### کاتی ئیعتیکاف :

بۆ ئیعتیکاف کردن کات دیاری نەکراوە کە پێویستە چەنێک بمێنیتەوە لەمزگەوت ، بۆیە دەتوانی چەند کاتژمێرێ ، یاخود شەوێ یا هەر دە شەوەکەی کۆتایی ئیعتیکاف بکەی کە ئەمەیان زۆرترینە و پێغەمبەر ﷺ ئەمەی کردوە و خێزانەکانی لە دوای خۆی کردوویانە . [٣]

---

(١) بڕوانە: پوختەی شەریعەت لە ئامادەکردنی بەندەی تاوانبار

(٢) البخاري: ٢٠٢٦ ، ومسلم: ١١٧٢

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو



هەروەها بۆ ژن و پیاو درووستە ئیعتیکاف بکات بەڵام بەمەرجی خۆی .

## ئەگەر ئیعتیکافت کرد :

- هەوڵبدە لەو مزگەوتە ئیعتیکاف بکەی کە پێی ئاسودەی .

- هەوڵبدە تا ئەتوانی خەریکی عیبادەت و شەونوێژ و قورئان خوێندن بە .

- دووربکەوە لە مۆبایل و ئەنتەرنێت و ئەوانە .

- هاوڕێیەتی موعتەکیفی تەمەڵ مەکە .

- زۆر گوێ بەخواردن و خواردنەوە مەدە بۆئەوەی چێژ لە ئیتیکافەکەت ببینی.

## ئەگەر ژنان ئیعتیکافیان کرد :

ئەگەر ژنان ئیعتیکافیان کرد پێویستە لەسەریان :

- سەرەتا نیەتی پاک بکاتەوە و تەنیا مەبەستی ڕەزای خودا بێ کە ئەمە بۆ پیاو و ژن پێویستە .

- پێویستە مۆڵەت لە بەخێوکەر یان مێردەکەی وەرگرێ .

- پێویستە پاک بێ و لە حەیز نەبێ .

- پێویستە ڕەچاوی جلی شەرعی بکات لەکاتی هات و چۆ .

- پێویستە لە مزگەوتێ ئیعتیکاف بکات شوێنی تایبەتی تیابێ بۆ ژنان .



- پێویستە خۆی بپارێزێ لەچاوی کامێراکان .

- پێویستە خۆی بپارێزێ لە تێکەڵاوی ناشەرعی ئەگەر لەگەڵ بەڕێوەبەر و مامۆستای مزگەوتەکەش بێ .

- پێویستە ئەگەر مێردەکەی داوای لێکرد ئیعتیکافەکەی بپچڕێ گوێڕایەڵی بکات .

- لە فیتنە پارێزراو بێ .

- مافی مێردەکەی و ئەوانەی مافیان بەسەرەوەیە وەک دایک و باوک و منداڵ نەفەوتێنێ .





## ڕەمەزان مانگی قورئانە

خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: { شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ}. البقرة: ١٨٥

هەروەها هەموو ساڵێ لە ڕەمەزان جبريل عليه السلام دادەبەزی و لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەوری قورئانیان دەکردەوە و ئەو ساڵەی کە وەفاتی کرد بیست شەو ئیعتیکافی کرد و دووجار لەگەڵ جبريل قورئانی دەورکردەوە.[١]

### خـــەتمی قورئـــان :

بەداخەوە ئێستا وای لێهاتوە موسڵمانان وا ئەزانن تەنیا دەبێ لە مانگی ڕەمەزان قورئان بخوێنرێ و دوای مانگی ڕەمەزان ئیتر دای دەخەن و نایخوێنن تا ئەوکاتەی کە گۆڕەکەیان لەسەر دادەخرێ و ئەوکات لە تازێکەی دەخوێنرێ کە بیدعەیە .

### قورئانی پیرۆز چەند مافێکی لەسەرمانە :

- جوان خوێندنەوەی
- ڕامان لە ئایەتەکانی
- تێگەیشتن و زانینی ماناکەی

-----------------------

(١) أحمد: ٣٤٢٢ ، وابن ماجه: ١٧٦٩ وأصله في الصحيحين



- دەورکردنەوە و گەیاندنی
- کارپێکردن و گەڕانەوەی حوکم بۆلای . [١]

## دابەشکردنی کاتەکان بۆ خەتمی قورئان

ئەگەر بتەوێ سێ ڕۆژ جارێ خەتمێ بکەی ئەوا دەتوانی پێش هەر نوێژێ جوزئێک و پاش هەر نوێژێ جوزئێک بخوێنیت و ئەوکات ڕۆژی ١٠ جوزء ئەخوێنیت و سێ ڕۆژ جارێ خەتمێ دەکەیت و مانگەکە ١٠ خەتم دەکەیت .

ئەگەر ئەوە قورس بوو بەلاتەوە دەتوانی بیکەیتە نیوە یانی هەر ڕۆژێ ٥ جوزء بخوێنیت بەجۆرێ لە پێش هەر نوێژێ نیو جوزء و لە پاش هەر نوێژێ نیو جوزئی تر .

ئەگەریش ئەوە قورس بوو کاتت نەبوو ئەوا دەتوانی هەر دەڕۆژ جارێ خەتمێ بکەیت و مانگەکە دەبێتە ٣ خەتم .

ئەگەرنا ڕۆژی جوزئێ بخوێنە و لەمانگەکە خەتمێ بکە و بگری بۆ حاڵی خۆت کە کاتت بۆ هەموو شتێ هەیە جگە لە قورئان !

## چەندێتی و چۆنێتی :

کات زۆرە بۆئەوەی دوای ڕەمەزان بگەڕێیتەوە خزمەت قورئان و خۆت فێرەی ماناکەی بکەیت و لێی تێبگەی ، بۆیە فریو

---

(١) بڕوانە: تەجوید بە ئاسانی لە نوسینی بەندەی تاوانبار



نەخۆی بە وتەی ئەو کەسانەی ئەڵێن خەتمەیەک بە ڕامانەوە باشترە لە چەندین خەتمە بەبێ ڕامان !

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " هەرکەسێ یەک پیت لە کتێبەکەی خودا – قورئان – بخوێنێ پاداشتێکی بۆ هەیە و، پاداشتیش یەک بە دەیە، ناڵێم: ( الٓم ) یەک حەرفە ، بەڵکو ئەلیف حەرفێکە و ، لام حەرفێکە و ، میم حەرفێکە " . [١]

بۆیە ئەوانەی زۆر خەتم دەکەن بەبێ ڕامان لەڕووی چەندێتیەوە پاداشتیان زۆرترە .

ئەوانەشی خەتمی کەمتر دەکەن بەڕامانەوە پاداشتیان زۆرترە بەڵام لەڕووی چۆنێتیەوە .

---

(١) الترمذي: ٢٩١٠ وقال: هذا حديث حسن صحيح ، وحسنه شعيب الأرناؤوط



## سەرفترە یان زەکاتی فیطر



سەرفترە واجب دەبێ بەسێ مەرج:

١- موسڵمان بوون .

٢- پاشەکەوتی هەبێ لە خواردنی ڕۆژی جەژن .

٣- ئاوابوونی خۆری کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان .[١]

واجبە سەرفترە بدرێ لەبری خۆت و ئەوەشی بەخێوکردنی لەئەستۆی تۆیە وەک خێزان و منداڵ و دایک و باوک بەمەرجێ موسڵمان بن .

ئەندازەکەی نزیکەی ٢ کیلۆ و نیوە لە خواردنی زۆربەی خەڵکی ئەو شوێنەی تێیدا نیشتەجێی . [٢]

### خواردن یان نرخـــەکەی ( پـــارە ) !؟

یەکێک لەو بابەتانەی هەموو ساڵێ دەمەقاڵەی لەسەر درووست دەبێ بابەتی سەرفترەیە کە بەچ شێوەیەک دەربکرێ؟

بەپوختی بڕوانە وەڵامەکەی ..

---

(١) بڕوانە: پوختەی شەریعەت

(٢) بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو



ئەگەر فەقیرێکت ناسی پێویستی بە خواردن بوو بۆ جەژن ئەوا بە خواردن دەری بکە و باشترە ، ئەگەر نا بەپارەش درووستە ، لەبەرئەوەی :

– لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ پێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژن دەریان دەکرد ، بەڵام دوای پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژێ یا دووڕۆژ پێشیان خست ( کەواتە گۆڕانکاری لە کاتەکەی ڕوویدا ).

– لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ گەنم نەدراوە ، بەڵام دوای پێغەمبەر ﷺ هاوەڵان گەنمیان دەرکرد چونکە بۆ جەژن خواردنێکی خۆشبوە ( کەواتە گۆڕانکاری لە جۆری خواردنەکەش ڕوویدا ).

– لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ صاعێک لە جۆ یا خورما یا کەشک یا مێوژ دەدرا ، بەڵام دوای پێغەمبەر ﷺ هاوەڵان بۆ گەنم کردیانە نیو صاع ( کەواتە گۆڕانکاری لە کێشانەکەشی ڕوویدا ). (١)

– پاشان فەتوای ئەبو حەنیفە و ئیبنو تەیمیەی لەسەرە کە درووستە نرخ بدرێ لە بری خواردن ، والله أعلم.

-----------------------

(١) البخاري: ١٥٠٨ ، ١٥١١

## ســــەبارەت بە زەکات



زەکاتی پارە و دەغڵ و دان و مەڕومالاَّت و شمەکی بازرگانی پێویستی بەنوسینێکی سەربەخۆ هەیە و پەیوەست نیە بەڕەمەزانەوە ، بەڵام لەبەرئەوەی دەبێ ساڵی بەسەر بچێ و خەڵکیش بەهۆی شارەزانەبوون لە ساڵی کۆچی و پاشان لەبەرئەوەی هەژاران لە ڕەمەزان زیاتر پێویستیان پێیەتی ، بۆیە دەوڵەمەندان و خوا پێداوانیش لە مانگی ڕەمەزان زەکاتەکانیان دەردەکەن.[١]

---

(١) بۆ شارەزایی زیاتر بگەڕێوە بۆ کتێبە فقهیەکان یاخود ( پوختەی شەریعەت ) .



## جــــەژنی ڕەمــــەزان



لەکاتی بینینی مانگی شەوال :

- نوێژی تەروایح بەجەماعەت و لەمزگەوت کۆتایی پێ دێ و ، هەرکەس لەماڵەوە بۆخۆی ئەیکات .

- تەکبیرات (الله أكبر) دەکرێ تا کاتی نوێژی جەژن.[١]

- دارِشتنەکەی : بەهیچ شێوەیەک ڕیوایەت نەکراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە بەچ لەفز و دارِشتنێک تەکبیری کردوە ، بەڵام لە هاوەڵان رضي الله عنهم و شوێنکەوتوانەوە هاتوە: " اللهُ أكبر اللهُ أكبر، لا إلهَ إلَّا الله، واللهُ أكبر اللهُ أكبر، ولله الحَمْد "[٢]

ئەکرێ بکرێتە سێجار و دووبارەش بکرێتەوە .

- بەتەنیا و هەرکێ بۆخۆی و لەبەر خۆیەوە ئەیلێتەوە و بەجەماعەت و کۆرس درووست نیە و بیدعەیە و لە هاوەڵانەوە رضي الله عنهم ڕیوایەت نەکراوە.[٣]

-----------------------

(١) بڕوانە: سورەتی البقرة: ١٨٥

(٢) المصنف لابن أبي شيبة: ٢/ ١٦٨ کە ئەمە شێوەی تەکبیراتی عەلی و عبدالله ی کوڕی مەسعودە رضي الله عنهم

(٣) بڕوانە: مجموع فتاوى ابن باز: ١٣/ ٢١



- زەکاتی فیطر ( سەرفترە ) واجب دەبێ و کاتەکەی تا پێش نوێژی بەیانیە .

## حوکمی نوێژی جەژن

نوێژی جەژن گومـانی تێدا نیە شــەرعی یە و پێغــەمبەر ﷺ کردویەتی.[١]

بەڵام زانایان لەسەر حوکمەکەی جیاوازن :

- هەندێ ڕایان وایە کە فەڕزی عەینە وەک جومعە و دەبێ هەموو موسڵمانێکی نێری تەندرووستی ئازادی نیشتەجێ ئامادەی بێ، ئەمەش ڕای مەزهەبی ئەبوحەنیفە و ڕیوایەتێک لە ئەحمەد و هەڵبژێردراوی ئیبنو تەیمیە و ئیبنو قەییم و ئیبنو باز و ئیبنو عوثەیمینە رحمهم الله .[٢]

- هەندێ ڕایان وایە کە سوننەتی موئەکەدەیە ، ئەمەش ڕای مەزهەبی شافعی و ڕیوایەتێک لە ئەحمەد و ڕای زۆرێکە لە زانایانی سەلەف و خەلەف .[٣]

- هەندێ ڕایان وایە کە فەڕزی کیفایەیە وەک نوێژی جەنازە، ئەمەش ڕای مەزهەبی حەنبەلیەکانە و فەتوای لیژنە دائیمەی لەسەرە.[٤]

-----------------------

(١) بڕوانە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا لە وەرگێڕانی بەندەی تاوانبار

(٢) بڕوانە: پێگەی الدرر السنية

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو



## شێوەی نوێــژی جەژن :

دەبێ کەسی یەکەمی موسڵمانان یان جێگرەکەی لەدەرەوەی شار خەڵکی کۆ بکەنەوە بۆ نوێژی جەژن و بەبێ بانگ و قامەت.[١]

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان دەردەچوو بۆ شوێنی نوێژ - نوێژگە -، یەکەمین شتێک ئەنجامی دەدا نوێژەکە بوو، پاشان سەلامی دەدایەوە و، ڕووی دەکردە خەڵکی و، خەڵکیش لە ڕیزەکانی خۆیان دانیشتبوون، ئەویش ئامۆژگاری دەکردن و، فەرمانی پێدەکردن.[٢]

## ژمارەی ڕکاتەکانی :

نوێژی جەژن دوو ڕکاتە و هیچ نوێژێکی سوننەت لە پێش و پاشیەوە نیە .[٣]

لەڕکاتی یەکەم پێش خوێندنی فاتیحە و دوای تەکبیرەی نوێژ دابەستن - ئیحرام - ٧ تەکبیرات - الله أكبر - دەکرێ و لەڕکاتی دووەم ٥ تەکبیرات دەکرێ .[٤]

-------------------------

(١) مسلم: ٨٨٧

(٢) البخاري: ٩٥٦ ، ومسلم: ٨٨٩

(٣) مسلم: ٨٨٤ /١٣

(٤) أحمد: ٦٦٨٨ ، وأبوداود: ١١٥١ ، وابن ماجه: ١٢٧٦ وحسنه لغيره شعيب الأرناؤوط



هـیچ زیكـرێ لە پێغـەمبەرەوە ﷺ نەهـاتوە، كە لە نێـوان تەكبیراتەكان خـوێندبێتی.[١]

## ئادابەكانی ڕۆشتن بۆ نوێژی جەژن

- خۆ شۆردن ( غوسل ) لە ئیبنو عومەرەوە رضي الله عنهم ڕیوایەت كراوە كە خۆی شۆردوە .[٢]

- پێش دەرچوون بۆ نوێژ خورما خواردن سوننەتە ئەگەر دەست نەكەوت هەر شتێكی تر بێ وەك ئاو .[٣]

- تەكبیرات كردن تا كاتی نوێژەكە وەك پێشتر باسمان كرد .

- خۆ ڕازاندنەوە و جوان و تازە پۆشین .[٤]

- پیرۆزبایی لەیەك كردن بە هەر شێوەیەك كە عورفە لەناو ئەو كۆمەڵگایەی تێیدا دانیشتوی ، باشترینیان دوعای خێركردنە بۆ یەكتری وەك : " تقبل الله منا ومنكم " .[٥]

- ڕێگا گۆڕین لە ڕۆشتن و هاتنەوە .[٦]

-----------------------

(١) بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية ، و زاد المعاد لابن القيم ، الشرح الممتع لابن عثيمين

(٢) الموطأ: ٤٨٨

(٣) البخاري: ٩٥٣

(٤) البخاري: ٩٤٨

(٥) بڕوانە: فتح الباري

(٦) البخاري: ٩٨٦



## بــەردەوام بــوون



ئەوە جەژن هات و ڕەمەزان کۆتایی هات و دەرگاکانی دۆزەخ کرانەوە و شەیتانەکان بەڕەڵا کران ..

تۆ ئەتەوێ بەردەوام بی یا ئەوەی کردوتە هەڵیوەشێنیتەوە؟

خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: {وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ }. الحجر: ٩٩

یەقین لێرە یانی مردن ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانەکەی خــودای جێبەجێ کرد تاوەکو یەقینی بۆ هــات و گــەڕایەوە لای پەروەردگاری ..

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " ئەگەر یەکێ لە ئێوە مرد کردەوەکانی ئەپچڕێ ". [١]

کەواتە پشوودان لە عیبادەت و خوا پەرستی نیە و ئەبێ بەردەوام بی تاوەکو مردن .

ناوخۆمانە وتەیە باوە : ئەو خوایەی لە ڕەمەزان دەیپەرستی هەر ئەو خوایەیە کە لە پاش ڕەمەزانیش دەبێ بیپەرستی !

---

(١) مسلم: ٢٦٨٢

بۆیە بەخێرایی و پوختی سەرنجت ڕا ئەکێشم بۆ چەند کردەوەیەکی ئاسان بۆئەوەی لەدوای ڕەمەزانیش بەردەوام ببی لە عیبادەت و خوا پەرستی .

## لە ڕۆژوو گرتن :

– شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بگری – شەشەڵان – وەک ئەوە وایە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بی . [١]

– سێ ڕۆژ لەمانگێ بگری وەک ئەوە وایە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بی [٢]، چونکە چاکە یەک بەدەیە .

– ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە – نۆمینەی حاجیان – بگری ئەبێتە کەفارەتی تاوانە بچوکەکانی دوو ساڵ . [٣]

– ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا – ١٠ی موحەڕەم – بگری ئەبێتە کەفارەتی تاوانە بچوکەکانی ساڵێکی پێش خۆی . [٤]

– یەک ڕۆژ بەتەنیا بگری خودا ٧٠ ساڵ ڕووخسارت لە ئاگر دوورەخاتەوە .[٥]

---

(١) مسلم: ١١٦٤

(٢) متفق علیە

(٣) مسلم: ١١٦٢

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٥) متفق علیە



## نوێژی جەماعەت لە مزگەوت :

لەسەر نوێژی جەماعەت و ڕۆشتن بۆ مزگەوت پاداشتی زۆر باسکراوە ، بەڵام لەهەمووی گەورەتر ئەوەیە کە: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "هەرکەسێ بەدەستنوێژەوە لەماڵ دەرچێ بۆ نوێژێکی فەرز ، پاداشتەکەی وەکو پاداشتی حاجیەکە لە ئیحرام دا بێت". (١)

ڕامێنە لەو پاداشتە گەورەیە کە تۆ دەتوانی لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار بەدەستی بێنی ...!

ئەوجا چەندین پاداشتی دیکە لە ئەنجامدانی نوێژی جەماعەت دەستدەکەوێ : (٢)

- هەر لەوەی بەڕێگاوە هەنگاوێ پاداشتت بۆ دەنوسرێ و هەنگاوەکەی تر تاوانت دەسڕێتەوە .

- نوێژی جەماعەت ٢٧ پلە بەرزترە بەسەر نوێژی تاکەوە .

- ئەوجا پاداشتی ڕیزی یەکەم .

## قورئان خوێندن :

سەرەڕای ئەوەی واجبە و مافێکی قورئانە بەسەرمانەوە کە بیخوێنینەوە و دەوری بکەینەوە ئەوا پاداشتی زۆریش بۆ خوێنەری قورئان هەیە ، لەوانە:

-----------------------

(١) أحمد: ٢٢٣٠٤ ، وأبوداود: ٥٥٨ وصححه شعیب الأرناؤوط

(٢) بڕوانە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا لە وەرگێڕانی بەندەی تاوانبار، هەروەها هەموو ئەوانە فەرموودەی سەحیحی لەسەرە

– پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "باشترینتان ئەوانەن قورئان فێردەبن و خەڵکیش فێردەکەن ".[١]

– پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: " هیچ دەستەیەک کۆ نابنەوە لەماڵێک لەماڵەکانی خودا، قورئانەکەی بخوێنن و لەنێوان خۆیاندا دەوری بکەنەوە، ئیلا ئارامی دادەبەزێتە سەریان و، ڕەحمەت دایان دەپۆشێ و، فریشتەکان دەوریان لێدەدەن و، خودا لای فریشتە نزیکەکانی باسیان دەکات".[٢]

جا چ پاداشتێ لەوە گەورەترە خودا باست بکات ..!

## زیکــر کــردن :

لەباسی فەزڵەکانی زیکر کردن پێویستەکا کتێبێکی سەربەخۆ بنوسین ..

بەڵام تەنیا یەک بیرخستنەوەی گەورە بیری خۆمان دەخەینەوە، ئەویش :

خوای پەروەردگار بەو گەورەیی و بێ منەتیەی خۆی ئەفەرموێ: { فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ }. البقرة: ١٥٢

یادم بکەن یادتان دەکەم

باسم بکەن باستان دەکەم

چ مژدەیەک لەوە گەورەترە ...!

---

(١) البخاري: ٥٠٢٧

(٢) مسلم: ٢٧٠٠



## شـــەونوێــژ:

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "باشترین نوێژ لەدوای نوێژەفەرزەکان شەونوێژە".(١)

بیرمە ساڵی ١٤٣٤ ی کۆچی کتێبێکم ئەخوێندەوە لەسەر مامەڵەی ڕۆژانەی پێغەمبەر ﷺ ، نوسەر لەباسی شەونوێژ نوسیبوی: ئەگەر بەیەک ڕکاتیش بووە خۆت لە کاروانی شەونوێژان دوا مەخە.(٢)

وا (١٠) ساڵە زیاترە کاریگەری ئەو وتەیە لەسەرمە و بەدەگمەن نەبێ نەمهێشتوە یەک شەو نوێژم بچێ !

## بەخشــــــین :

سەبارەت بە بەخشین دیسانەوە ئایەت و فەرمودە زۆر هاتوە لەسەر فەزڵەکانی، بەڵام تەنیا یەک ئایەت باسەکەین :

خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: {وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ}. المنافقون: ١٠

---

(١) مسلم: ١١٦٣

(٢) بڕوانە: کتێبی: استمتع بحياتک، خۆشبەختانە کراوەتە کوردی بەناوی " بەختەوەر بژی "

خۆزگە خواستن لەسەرە مەرگ و گەڕانەوە و داوای مۆڵەت کردن تەنیا بۆ یەک شت ، ئەویش بەخشین ..

دەبێ بەخشین چەن گەورەبێ وا مرۆڤ لەسەرەمەرگ داوای مۆڵەتی بۆ دەکات ...!؟



## ناوەڕۆك

